بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله الذي أمر بالجهاد في سبيله، ووعد عليه الأجر العظيم والنصر المبين، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له القائل في كتابه الكريم (وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نصْرُ الْمُؤْمِنِينَ)الروم:٤٧ وأشهد أن محمدا عبده ورسوله وخليله قائد المجاهدين وأصدق المناضلين وأنصح العباد أجمعين ﷺ وعلى آله الطيبين الطاهرين، وعلى أصحابه الكرام الذين باعوا أنفسهم لله وجاهدوا في سبيله حتى أظهر الله بهم الدين وأعز بهم المؤمنين، وأذل بهم الكافرين رضي الله عنهم وأكرم مثواهم وجعلنا من أتباعهم بإحسان إلى يوم الدين.

موعتەزیلە چین و کێ بوون هەروەها عەقیدەیان چی بوو؟؟

موعتەزیلە تاقمێکی ئیسلامی گومڕای کاریگەرن لەڕووی بەکارهێنانی عەقڵ لەسەر حیسابی دەقە شەرعییەکان، لەسەرەتای سەدەی دووەمی کۆچی لە بەسرە لەسەر دەستی دامەزرێنەکەی کە (واصل بن عطای غەزالی) بوو سەریان هەڵدا، ئەم کەسە لە ساڵی ٨٠ی هیجری لە شاری مەدینەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە دایک بووە

کەسێکی زیرەك و قسەزان بووە هەروەکو ئیمامی ذەهەبی لە کتێبی (سیر اعلام النبلاء) پێی دەڵێت: (البليغ الأفوه) واتا قسەزانی بەدەم و دوو.

ئەوان بە تەواوی پشتیان بە عەقڵ بەست سەبارەت بە بیروباوەڕەکانیان و پێشیان خستە سەر ئایەت و فەرموودەکاندا، دەیانووت: عەقڵ و فیترەتی ساغ بە خۆیان دەتوانن حەڵاڵ و حەرام لەیەکتر جیابکەنەوە،

موعتەزیلە لە ڕووی زمانەوانیەوە واتا : وازهێنەرەکان

## بۆچی پێیان دەوترێت موعتەزیلە ؟

لەبەر ئەوەی ڕۆژێکیان ئەم پیاوە (واصلی کوڕی عەطاء) لە مەجلیسی حەسەنی بەصری دادەنیشێت ودەبێت بە گفتوگۆیان لەسەر حوکمی فاسق، ئەم پیاوە دەیگوت فاسق نە ئەوەتا کافر بێت و نە ئەوەتا ئیماندار بێت! بۆیە لەسەر ئەمە حەسەنی بەصری دەریکرد لە مەجلیسەکەی و عەمرِی کوڕی عوبێدیش هەڵسا لەگەڵی چونە دەرەوە

و ئیتر نەهاتنەوە بۆ مەجلیسەکەی حەسەنی بەصری رەحمەتی خوای لێ بێت.
وازیان لەو مەجلیسە هێنا، لەبەر ئەمە ناویان لێ نان موعتەزیلە واتا وازهێنەرەکان.

## عەقیدە و بیرو بۆچونیان چۆن بوو ؟

موعتەزیلەکان هەموویان بە یەك بیروبۆچون و یەك عەقیدەوە هاتنە مەیدان، دواتر خیلاف و ناکۆکی کەوتە نێوانیانەوە هەتا ئەوەی کۆمەڵێك بیرو بۆچون و عەقیدەیان لێ دروست بوو (کە ئەمە پیشەی هەموو فیرقەکانە لە سەرەتاوە وەکوو یەکن دواتر ناکۆکی دەکەوێتە نێوانیان)
بەڵام موعتەزیلەکان پێنج بنەمایان هەبوو کە هەموویان کۆك بوون لەسەر ئەم بنەمایانە و عەقیدەیان لەسەری دامەزراندبوو، بە موعتەزیلە دانەئەنرایت ئەگەر دانت بەو پێنج بنەمایەدا نەنایە .

## ئەو پێنج بنەمایە چی بوون ؟

### ١. تەوحید:

مەبەستیان لێی ئەوە بوو کە الله تعالی تاك و تەنیایە و هیچ لە شکڵ و شێوەی نیە، بەڵام ئەوان هەموو سیفەتی الله تعالایان ڕەت دەکردەوە، دەیانگوت الله تعالی هیچ شکڵ و شێوەیەکی نیە، نە درێژە نە کورتە نە پانە نە ڕەنگی هەیە نە بۆنی هەیە نە تامی هەیە نە ساردە نە گەرمە......هتد

هەروەها سیفەتی جێگیربوون وەکوو زانست و توانا (علم وقدرة) ئەوەشیان هەر ڕەتدەکردەوە، بە کورتی تەوحید لای ئەوان جێگیر بوو بەڵام هەموو سیفەتیکی الله تەعالایان ڕەت دەکردەوە.

## ٢. دادپەروەری:

مەبەستیان لەم خاڵە ئەوە بوو کە لێکدانەوەیان بۆ ئەحکامەکانی الله تعالی دەکرد بەوەی کە لەگەڵ عەقڵ ودانایی خۆیان بگونجێت، بەمەش هەندێك شتیان ڕەت کردەوە وهەندێکیان بە واجب زانی.

ڕەتیان کردەوە کە الله تعالی دروستکەری کردەوەی عەبدەکانی بێت، دەیانگوت عەقڵ بێ لایەنە لە چاککردن و خراپکردن، ئەوەی عەقڵ بە چاکی زانی ئەوە چاکەیە ئەگەر ئەو کارە چاکەیە بکات ئەوە پاداشتی لەسەر وەردەگرێت، ئەوەی عەقڵ بە خراپی زانی ئەوە خراپەیە ئەگەر ئەو کارە خراپە بکات ئەوە سزای لەسەر وەردەگرێت !!!

بەمەیان دەگوت دادپەروەری.

## ٣. جێگای نێوەندی کوفر و ئیمان:

ئەم خاڵە حوکمی فاسقی ڕووندەکردەوە لەلای موعتەزیلەکان لە دونیادا، ئەم باسە ناکۆکی دروست کرد لە بەینی(واصلی کوڕی عەطاء و حەسەنی بەصری) ، موعتەزیلەکان پێیان وابوو کە فاسق نە ئیماندارە و نەکافرە بەڵکو لەو نێوەندەیا ماوەتەوە، ئەگەر تەوبەی کرد دەگەڕێتەوە ناو ئیمان وئەگەر سووریش بوو لەسەر تاوانەکەی ئەوە بە کافری ئەمرێت وبۆ هەتا هەتایە لە دۆزەخ دەمێنێتەوە .

بێگومان ئەم خاڵەش پێچەوانەی ئەهلی سوننە وجەماعەیە .

## ٤. بەڵێن وبەڵێنایەتی:

موعتەزیلەکان پێیان وابوو کە الله تعالی بەڵێنی خۆی جێبەجێ دەکات لەسەر ئەوانەی کە تاوانی گەورەیان کردوە (کبیرە) وە هیچ شەفاعەتێك نایانگرێتەوە، وە قەت قەتیش لە دۆزەخ دەرناچن لەبەر ئەوەی تاوانی گەورەیان ئەنجام داوە، هەروەکو ئیمامی شەهرستانی دەڵێت: موعتەزیلەکان دەیانگوت مرۆڤی ئیماندار ئەگەر لە دونیا بە تەوبە کردن و گوێڕایەڵی الله دەرچوو ئەوە شایەنی پاداشت و قەرەبوکردنەوەیە، هەروەها ئەگەر تەوبەی نەکرد لەو تاوانە گەورانەی کە کردویەتی ئەوە شایەنی مانەوەیە لە دۆزەخ بۆ هەتا هەتایە بەڵام سزای کەمترە لە سزای کافر، بەم جۆرە بۆچونەیان دەگوت بەڵێن و بەڵێنایەتی .

## ٥. ئەمر كردن بە چاكە ونەهی كردن لە خراپە:

ئەم خاڵە بۆچونی موعتەزیلەكان ڕووندەكاتەوە لەبەرامبەر ئەو كەسانەی كە تاوانی گەورەیان ئەنجامداوە ئەگەر دەسەڵاتدار بن یان بێ دەسەڵات زانایان دەفەرموون: موعتەزیلەكان كۆك بوون لەسەر واجبێتی ئەمر بە چاكە و نەهی لەخراپە بە بوونی توانا بە دەست یان زوبان یان شمشێر هەرچۆنێك بتوانن، ئەوان بۆچونیان وابوو كە حاكم یان دەسەڵآتدار هەر بێ ئەمریەكی الله ی كرد ئیتر دەبێت هەڵسیت لێی بێ گومان لە كاتێكدا كە توانات هەبوو.

ئەمەی سەرەوە ئەو پێنج بنەمایە بوو کە موعتەزیلەکان بڕوایان پێی هەبوو وەکۆك بوون لەسەری.

هەروەها هەندێك بیرو بۆچونی دیکەشیان هەبوو بەڵام هەموویان لەسەری کۆك نەبوون هەندێکیان بڕوایان پێی هەبوو هەندێکیان نا لەوانەش :

## ١. تێگەیشتنیان بۆ بینینی الله تعالی:

هەموو موعتەزیلەکان کۆك بوون لەسەر ئەوەی کە الله تعالی نابینرێت بە چاو نە لە دونیا و نە لە ئاخیرەتیش، دەیانگوت ئەگەر قەرار بێت ببینرێت دەبێت بڵێین لاتەنیشتیشی دەبێت و شوێنیشی دەبێت ئەمەش بۆ عەظەمەتی الله ناگونجێت.

تەفسیریشیان بۆ ئایەتی: (وجوه یومئذ ناضره الی ربها ناظره) دەیانگوت منتظره واتا لەچاوەڕوانیدایە .

**٢. دەیانگوت قورئان دروست کراوە(مەخلوقە):**

ئایەتی (خالق کل شیئ) واتا : دروستکەری هەموو شتێکە دەیانگوت قورئانیش یەکێکە لەو شتانە .

**٣. تێگەیشتنیان بۆ بەرزبونەوەی الله تعالی(علو):** تەفسیریان بۆ ئایەتی: (الرحمن علی العرش استوی) دەیانگوت استوی واتا استولی.

**٤. تێگەیشتنیان بۆ شەفاعەتی پێغەمبەری خوا ﷺ**

بۆ ئەو کەسانەی کە تاوانی گەورەیان کردوە لە ئوممەتەکەی (کەبیرە) دەیانگوت شەفاعەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەو کەسانە نیە هەروەکو ئیمامی ئەشعەری لە المقالاتدا باسی کردوە.

٥. بەصیرە و فیراسەی پیاو چاکانیان بە هەموو شێوەیەك رەتدەکردەوە، دەیانگوت ئەگەر پیاوچاك بەصیرەی هەبێت کەواتە وەکوو پێغەمبەران وان .

## ئەو فیرقە و بیر وبۆچونانەی کە لە موعتەزیلە جیا بوونەوە:

١. (الواصلية) ئەمانە هاورێ و هاوەڵەکانی واصلی کوڕی عەطاء بوون هەروەکوو باسمان کرد دامەزرێنەری ئەم فیرقە گومڕایە بوو هەروەها قوتابی حەسەنی بەصری بوو کە لە مەجلیسەکەی دەریکرد و ئیتر نەگەڕایەوە .

٢. (الهذيلية) ئەمانە هاوەڵی حەمدانی کوڕی هوذەیلی عەللاف بوون کە بە شێخی موعتەزیلەکان ناسراو بوو، بڕوای وابوو کە ئەهلی بەهەشت و ئەهلی دۆزەخ لە جوڵە دەکەوەن و دەچنە حاڵەتێکی سڕ بونەوە ئیتر بۆ هەتا هەتا وادەمێننەوە .

٣. (النظامية) ئەم کۆمەڵەش شوێنکەوتەی ابراهیمی کوڕی یەساری کوڕی هانی بوون ئەمانە قسەی فەیلەسوفەکانیان تێکەڵ بە فیرقەی موعتەزیلە کرد، بڕوایان وابوو کە الله تعالی سیفەتی توانا (القدرة)ی نیە وەکاتێك ئەهلی بەهەشت و دۆزەخ دەچنە شوێنی خۆیان ئیتر الله تعالی توانای نیە نە دەریان بکات و نە سزاو پاداشتیان زیاد بکات، پەنا بە الله.

٤. (الخابطية والحدثية) ئەم کۆمەڵەش شوێنکەوتەی احمدی کوڕی خابط وفضل الحدثی بوون ئەمانە بڕوایان وابوو کە عیسای کوڕی مەریەم لە ڕۆژی قیامەت وەکوو الله تعالی لێپرسینەوە لەگەڵ مەخلوقات دەکات، هەروەها دەیانگوت کە الله تعالی نابینرێت بە چاو لە بەهەشتدا بەڵکو ئەو بینینەی لە فەرمووودەیا هاتوە بینینی عەقڵە نەك چاو .

٥. (البشرية) ئەمانە شوێنکەوتەی بشری کوڕی المعتمر بوون هەر وەکوو ئیمامی ذەهەبی لە (سیر اعلام النبلاء) باسی دەکات کە پیاوێکی عاقڵ بوو بەڵام هیدایەتی وەرنەگرت، یەکێك بوو لە زانا گەورەکانی موعتەزیلە، بڕوای وابوو کە الله تعالی تواناى هەیە منداڵ سزا بدات، ئەگەر ئەو کارەش بکات ئەوە مانای ئەوەیە کە الله زاڵمە، نعوذ بالله.

٦. (المرادية) ئەمانە شوێنکەوتەی عیسای کوڕی صەبیح ناسراو بە المراد بوون لەو قسانەی کە ئەم کەسە دەیکرد، دەیگوت الله توانای هەیە درۆ بکات و زوڵم وستەمیش بکات، کەوابوو خوایەکی درۆزن و زاڵمە پەنا بە الله تعالی.
هەروەها دەیگوت هەرکەسێك بڕوای بە خەلقی قورئان نەبێت کافرە .

٧. (الثامية) ئەمانە شوێنکەوتەی ثمامەی کوڕی ئەشرەس بوون کە بڕوایان وابوو لە ڕۆژی قیامەت هەرچی کافر وموشریك ومەجوس و جولەکە و نەصرانیەکان لەگەڵ ئاژەڵ وباڵندە و منداڵی ئیماندارانیش دەبن بە خۆڵ و کەس سزا نادرێت بە دۆزەخ .

٨. (الهشامية) ئەمانە شوێنکەوتەی عەمری کوڕی الفوطی بوون کە بڕوایان وابوو الله تعالی تواناى سنورداره و تواناى هەمو شتێکی نیە، هەروەها بڕوایان وابوو کە ئێستا بەهەشت ودۆزەخێك نیە لە ئارادا، پێغەمبەرایەتیش پاداشتێکە الله دەیداتە ئەو کەسانەی کاری چاك دەکەن و هەتا هەتاش هەر دەمێنێت .

ئەمانەی کە باسمان کرد عەقیدە و بیرو بۆچونی موعتەزیلە بوو بە هەموو لق و پۆپەکانیانەوە، ڕاستە ئەمانە ئێستا لە سەردەمی ئێمەدا نەماون و ئەو ناوە کۆتایی پێ هاتوە، بەڵام دەبێت ئەوە بزانین کە عەقیدە و بیر بۆچونە بۆگەنەکانیان هەتا ئێستاش لەناو خەڵکیدا هەر ماوە بەناوی جۆراو جۆرەوە.

بۆیە خوشك برای ئیماندارم دەبێت زۆر ئاگاداری عەقیدە و ئیمانت بیت بەتایبەتی لەم زەمەنی پڕ فیتنە وئاژاوەیەدا کە فیتنە وەکوو قەترەی باران دەبارێت، پیاو ئێوارە دەکاتەوە ئیماندارە و بەیانی هەڵدەستێت کافر بوە، بەیانی هەڵدەستێت ئیماندارە و ئیوارە دەکاتەوە کافر بوە هەروەکوو سەروەرمان دەفەرمووێت ﷺ.
خۆ ئەم فیرقانەش هەموو خۆیان بە موسوڵمان و زانا دەزانی لەناو ئیسلام سەریان هەڵدا !!!
بۆیە زۆر گرنگە کە بزانیت دین لە کێ ولە کویێ وەردەگریت.

وتمان: موعتەزیلە بە شێوەیەکی گشتی پشتیان بە عەقڵی خۆیان دەبەست بۆ تێگەیشتن لە ئیسلام، هەر بۆیە سیفەتەکانی خوای پەروەردگار یان بەپێی تێگەیشتنی خۆیان تەئویل کرد و لێکدایەوە، تەنانەت لە هاوەڵاندا و بە درۆزن ئەوانیان ژمارد، ئینجا لەبەر ئەوەی کاریگەری فەلسەفەی هیندی و یۆنانیان لەسەر بوو، شەریعەتی ئیسلامیان کرد بە کۆمەڵە پرسێکی عەقلی وجەدەلی بە ئارەزووی خۆیان.

زانایان بەرپەرچی موعتەزیلەکانیان داوەتەوەو یەکەمین کەس کە بەئاگری ئەوان داخ بوو ئیمامی (احمد بن حنبل) بوو رحمە اللە، لە مەسەلەی خەلقی قورئان..

موعتەزیلە چەندین تاقمی گومڕان لەنێوخۆیاندا، وەکو: الواصلیة، الهذیلیة، النظامیة، البشریة، ...هتد هەر یەکێ لەم کۆمەڵانەش بەهۆی هەندێ لادانی جیاواز لە ئەوانی تر جیا دەبوونەوە چونکە هەموویان پشت بەستنی تەواویان لەسەر عەقڵ و بۆچوونی خۆیان بوو بەتەنها.

دیارترین کەسایەتییەکانی دوای (واصل بن عطاء) ئەمانە بوون (أبو الهذیل العلاف، إبراهیم النظام، بشربن المعتمر، الجاحظ، القاضي عبد الجبار).

ئەمە بەکورتی سەبارەت بە موعتەزیلە لە ڕابردوودا، بەڵام ئەوان لەم سەردەمی خۆیشماندا بوونیان هەیە لە وڵاتە عەرەبیەکان، و کوردستان و هتد... لایەنگر و شوێنکەوتوویان هەیە لەسەر ئاستێکی سەرەتایی، چونکە ئەمان لە موعتەزیلە کۆنەکان بەوە جیا دەبنەوە کە ئەوان سەرەڕای ئەوەی گومرا بوون بەڵام زانستیان هەبوو و خوێندنەوەی زۆریان هەبوو بەڵام بەهۆی تەفسیر کردنی قورئان بە تێگەیشتن وهەواو ئارەزووی خۆیان و کارنەکردنیان بە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ گومڕا بوون، لە کاتێکدا ئەمانەی لای خۆمان وەکو تووتی قسەکانیان وەردەگێڕن دووبارەی دەکەنەوە بێ ئەوەی نە لە زانستی نەقل و نە لە زانستی عەقڵ شارەزایی باشیان هەبێت.

موعتەزیلە لەم سەرەدەمەدا به گورو تینێکی تازەوە گەڕاونەتەوە گۆڕەپانی ئیسلامی و زیاتر لە ناو حیزبە ئیسلامییەکان و بەتایبەتی لە ڕیزەکانی کۆمەلی الإخوان المسلمین و نەهزەی تونسیدا بوونێکی ڕوون و ئاشکرایان هەیە، هەروەها لەسەر ئاستی کەسایەتی و نووسەر و ڕۆشنبیر و بانگخوازاندا بوونیان هەیە، عەلمانییەکانیش بە گشتی پێشوازییەکی گەورم لەو بیرکردنەوە دەکەن و ڕێز لە هەڵگرانی ئەو بیروباوەڕە دەکەن!

بەڵام ئەمانیش وەکو مورجیئە و خەواریج هەموو بیرۆکە و عەقیدەکانیان لە جەماعەتێکی دیاریکراودا بە تەواوی ڕەنگی نەداوەتەوە، بەڵکو بە ڕێژەیە و کەمێکیش جوانکاری و گۆڕانکاری بۆ دەکەن وەکو خۆڵ لە چاوکردنی خەڵکی بۆ ئەوەی قبول بکرێت..

سەبارەت بە کوردستانی خۆمان، بە هەمان شێوە لەناو حیزبە ئیسلامییەکاندا بیروبۆچوونەکانی موعتەزیلە ڕەنگدانەوەو پشتگیری

زۆری لێ دەکرێت و لەسەر ئاستی سەرکردایەتی و کەسە دیارەکانیاندا بەرگری لە بیرۆکەکانیان دەکرێت، بەڵام بەهۆی ئەوەی ئاستی زانستی ئەو سەرکردانەی لەناو حیزبە ئیسلامییەکاندا پشتگسری لە بیرۆکەی موعتەزیلە دەکەن زۆر لاوازە، بۆیە زیاتر پاشکۆیی موعتەزیلە عەرەبە هاوچەرخەکانیان پێوە دیارە و گومڕاییەکەشیان هەر بە پاشکۆیی پاشکۆیی ئەنجام دەدەن و ناتوانن خۆیان بچنە ناو سەرچاوەکانی موعتەزیلە و لە بیروباوەڕو بنەماکانیان تێبگەن.

بۆیە هەروەکو ابن الوزير اليماني رەحمەتی الله لێ بێت دەڵێت: هەر عەقیدە و بیروبۆچونێك و دینداریەك كە لە زەمانی پێغەمبەر ﷺ و صەحابە بەڕێزەکانی نەبووە، ئەمڕۆ توش مەیکە بە دین وعەقیدە بۆخۆت، وە هەرکەسێك دەست بەو ئەصلەوە بگرێت دڵنیابن قەت گومڕا وسەرلێشێواو نابێت .

فنسأل الله عز وجل أن يعجل فرج هذه الأمة اللهم أقم علم الجهاد واقمع أهل الزيغ والفساد وانشر رحمتك على العباد. يا من له الدنيا والآخرة وإليه المعاد وصلى الله وسلم وبارك على عبده ورسوله نبينا محمد وعلى آله وأصحابه أجمعين.